چیرۆک بۆ منداڵان

# گرینگترین قەڵەم

وەرگێڕانی:

بەدران ئەحمەد حەبیب



## خانمێکی بچکۆلە

هەبوو نەبوو کچێکی بچکۆلە هەبوو. کەڵەشێرێکی جوان و دڵگری هەبوو. کەڵەشێرەکە هەموو ڕۆژێ لەگەڵ گەردوگۆڵی بەیانیان لەخەو ڕادەبوو. گۆرانیی دەگوت:

«کوو- ککوو- کوو- کووو، بەیانیت باش خانمەکەی خۆم!»

پاشان کەڵەشێرەکە ڕای دەکردە لای کچە بچکۆلەکە و بە دەندووک لەتکە نانی لێ دەرفاند. پەڕوباڵی کەڵەشێرەکە لە ڕەنگی پەلکەزێڕینە دەچوون. هەر دەتگوت بەڕۆن چەور کراون وا دەتریسکانەوە. پۆپیتە سوورەکەی لەبەر تیشکی هەتاو دەبریسکایەوە. بەڕاستی کەڵەشێرێکی جوان و بەدیمەن بوو.





ڕۆژێکیان کچە بچکۆلەکە، کوڕە دراوسێیەکی بینی مریشکێکی جوانی پێ بوو. هەر زوو حەزی چووە مریشکەکە، گوتی:

«تۆ مریشکی خۆتم بدێ، منیش کەڵەشێری خۆمت دەدەمێ!»

کەڵەشێر گوێی لەم وشانە بوو، پۆپیتەی بەردایەوە و سەری لار کردەوە. (نا، نەخێر هیچی لە دەست نەدەهات. خانم دەیگۆڕیەوە).

کوڕە دراوسێ گوتی باشە و کەڵەشێرەکەی لەجیاتی مریشکەکە برد.

هەر زوو کچە بچکۆلەکە و مریشکەکە بوونە هەڤاڵ. مریشک ئەو پەڕەوڵە جوان و دڵگرە، هەموو ڕۆژێ هێلکەیەکی سپی وەک بەفری دەداییێ.

«کورک، کورک، خانمەکەم، فەرموو ئەم هێلکەیە بخۆ!»

کچە بچکۆلەکە هێلکەکەی دەخوارد. پاشان مریشکەکەی لە ئامێز دەگرت و دەستی بە پەڕ و تووکی دادەهێنا. دان و ئاوی دەداییێ.





ڕۆژێکیان کچە دراوسێیەک هاتە ئەو ناوە. مراوییەکی پێ بوو. کچە بچکۆلەکە حەزی چووە مراوییەکە و، بە کچە دراوسێیەکەی گوت:

«مراوییەکەتم بدێ، مریشکەکەمت دەدەمێ!»

مریشکەکە گوێی لەمە بوو. لە خەمانە پەڕوباڵی شۆڕ بوونەوە. زۆری پێ ناخۆش بوو. بەڵام هیچیشی لە دەست نەدەهات. خاوەنەکەی دەیگۆڕیەوە.

هەر زوو کچە بچکۆلەکە و مراوی بوونە دۆست. بەیەکەوە لە ڕووبارەکە مەلەیان دەکرد.

«کویک، کویک، خانمەکەی خۆم! دوور مەڕۆ، ڕووبارەکە قووڵە، ئاو دەتبا!»

ئیدی پاشان خانمی بچکۆلە کە لە ڕووبار دەهاتە دەرەوە و لە سەر لێواری ئاوەکە پشووی دەدا. مراویش دەهات لە تەنیشتی هەڵدەنیشت.





ڕۆژێکیان کوڕە دراوسێیەک هاتە لای ڕووبارەکە. جڵەوی تووتکە سەگێکی بە دەستەوە بوو. کچەکە سەرنجی گوجیلەکەی دا و گوتی:

«ئۆی لەم تووتکە جوانە! دەبا بۆ من بێ! منیش ئەم مراوییەی خۆمت دەدەمێ!»

مراوی بەم وشانە دڵتەنگ بوو. پشووی سوار بوو و بە باڵەکوتە کەوت، بەڵام هیچیشی لە دەست نەدەهات. کوڕەکە پڕی دایێ و لە بن هەنگڵی خۆی ناو بردی.

خانمی بچکۆلە دەستێکی بەپشتی تووتکە سەگەکە داهێنا و گوتی:

«کەڵەشێرێکم هەبوو، بە مریشکێکم گۆڕیەوە. پاشان مریشکەکەم بە مراوییەک گۆڕیەوە. مراوییەکەشم بە تۆ گۆڕیەوە.»





تووتکە سەگ ئەمەی بیست و لە ترسانە دڵی داچڵەکی. خۆی لە ژێر مێزەکە شاردەوە. شەو خانمی بچکۆلە نووستبوو. تووتکەکە بەچڕنووک دەرگای کردەوە و هەڵات. گوتی: «نامەوێ دۆستی خانمێک بم نرخی دۆستایەتی نەزانێت.»

بۆ بەیانی کاتێ خانمی بچکۆلە بەئاگا هات. سەیری کرد تووتکە سەگەکەی هەڵاتووە. خۆی بەتاک و تەنیایی بینی!





# ئەو شتەی عەلەشیش نایزانێ

هەبوو نەبوو عەلەشیشێک هەبوو. هەمیشە بیری دەکردەوە. بەڵام تەنیا و تەنیا بیری لە خۆی دەکردەوە. هەر لەو ڕۆژەی سەری لە هێلکە ترووکا، بیری کردەوە، گوتی: «گەلۆ، من گەلێک وردیلەم. دەبێ زوو گەورە ببم!» ئیدی گەورە بوو، هەر گەورە بوو تا هێندەی تووتکە بەرازێکی لێ هات. ئەوجا گوتی:

«ها ها، ئێستە باشم.»

بەرچێڵە سوورەی ژێر دەنووکی بەردایەوە. تا بڵێی عەلەشیشێکی گەورە بوو. چووە لای گۆمە ئاوێک و لە وێنەی خۆی ڕوانی. کلکی فش کردەوە و خۆی پف دا، گوتی: «لێم دا، ئێستا تەواوم!»

«زۆر بەخۆی دەنازی. هەموو کەسێکی لەکن گێژ و وێژ بوو. دەیگوت: «بەخوا نەزانن، هەر خۆم نەبێ کە ژیر و وریام.»

کچێکی بچکۆلە کە ناوی (ئاوا) بوو هاتە ناو باخەکە. عەلەشیش خۆی لێ گیف کردەوە، هێندەی نەمابوو زێڵەی (ئاوا) بڕژێنێ. لە دڵی خۆیشیدا دەیگوت:

«چما ئەوە منم! بەڕاستی ئازا و بەهێزم!»

پشووی هاوین هات. کابانی ماڵ ویستی بیگرێ و سەری ببڕێ. بەڵام عەلەشیش بازێکی دا و بەسەر پەرژینەکەدا ئاودیو بوو. خۆی کوتایە ناو دارستانەکەوە. ڕای دەکرد و لە دڵی خۆشیدا دەیگوت: «خەیاڵت خاوە، پێت وایە دەمگری؟ ناترسم، من لە تۆ فێڵبازترم.».



بەڵام خۆ لە ڕێوی فێڵبازتر نەبوو. لە دارستانەکەدا شەو داهات و ڕێوی بە ماتە ماتە لێی هاتە پێش. خۆی بۆ هەڵدا و بەکەڵەمبازێک گرتی.

ڕێوی گۆشتی عەلەشیشی دەماشتەوە و بەتیز و گاڵتەشەوە دەیگوت: «های لە خۆت گەوج و نەفامێ، بەدرێژایی ژیانت بیرت لە گەورەیی و جوانی و ئازایی خۆت دەکردەوە. بەڵام ئەو شتەی هەرگیز بیرت لێ نەدەکردەوە ئەوەبوو کە گۆشتێکی چەند بەلەزەت و خۆشت هەیە.»









# شێلم

باپیرە شێلمێکی ڕواند. شێلمەکە گەورە بوو، گەورە بوو، تا وای لێ هات زۆر گەورە بوو. باپیرە ویستی شێلمەکە هەڵکەنێ. هەر ڕای کێشا و ڕای کێشا بەڵام نەیتوانی هەڵی کەنێ.

بانگی داپیرەی کرد تا بێت و یاریدەی بدات.

داپیرە باپیرەی ڕاکێشا و، باپیرەش شێلمەکەی ڕاکێشا، هەر ڕایان کێشا و ڕایان کێشا، بەڵام نەیانتوانی شێلمەکە هەڵکەنن.

بانگی کچەزاکەیان کرد... کچەزا داپیرەی ڕاکێشا و، داپیرە باپیرەی ڕاکێشا و، باپیرە شێلمەکەی ڕاکێشا بەڵام هێشتا نەیانتوانی شێلمەکە هەڵکەنن.

بانگی تووتەڵە سەگەکەیان کرد، تووتەڵە سەگەکە کچەزای ڕاکێشا و کچەزا داپیرەی ڕاکێشا و داپیرە باپیرەی ڕاکێشا و، باپیرەش شێلمەکەی ڕاکێشا، هەر ڕایان کێشا و ڕایان کێشا، بەڵام نەیانتوانی شێلمەکە هەڵکەنن.

چوون بانگی مشکەکەیان کرد. مشک تووتەڵە سەگی ڕاکێشا و، تووتەڵە سەگ کچەزای ڕاکێشا و، کچەزا داپیرەی ڕاکێشا و، داپیرەش باپیرەی ڕاکێشا، هەر ڕایان کێشا و ڕایان کێشا، ئیدی شێلمەکە هەڵکەنا: بۆچی؟ چونکە مشک تەمبەڵ نەبوو بەیانیان وەرزشی دەکرد و زۆر بەهێز بوو.





# چۆلەکەی لەخۆبایی

هەبوو نەبوو چۆلەکەیەکی خۆش خوێنی، پەڕوباڵ ڕەنگینی، پۆپیتە زێڕین هەبوو. دەنگی زۆر ناسک و هەست بزوێن بوو. بەهاران لەناو گـولاڵە و چیمەنی مێرگ و مێرگوڵان تێی دەچریکاند. هەموو شتێکی دەهێنایە جۆش. هەر کەسێک گوێی لە دەنگی بوایە، بەموچڕکە و تەزووی شادمانی دەبزوا و دەهاتە سەما. دەیانگوت: ئای چتۆ چریکەی ناسک و دڵگری هەیە! ئای چەند بەجۆش دەخوێنێ!

جارێکیان چۆلەکەکە لەناو گولیلکان تێی هەڵکردبوو. بەئاوازێکی نەرم و نیان دەیچریکاند. گوێی لێ بوو یەکێک گوتی:

چـۆلـەکـــــــەی پـەڕوپـۆ ڕەنـگـین<br>وێنەت نیــــیــــە لەســــەر زەوین<br>جـــریوە و چریکەت هـەست بـزوێنە<br>خـــــەم لابەرە و شـــــادی هـێنە

نەیزانی کێ بوو ئەمەی گوت. چونکە هەموو جارێ کاتی خوێندن چاوی دادەخست. چۆلەکەکە بەم پێداهەڵگوتنە فریوی خوارد و لە خۆی بایی بوو. بڕیاری دا ئیتر نە بخوێنێ و نەسترانی بەجۆش و خرۆش بڵێ.

هەر زوو هەستیان کرد، چۆلەکەی خۆش خوێن لە جریوە کەوتووە. ناو بەناو زیرە زیرێکی لێ هەڵدەستێ و هەموو کەس کەڕ و کاس دەکا.

پاسارییەک لێی نزیک بووەوە و گوتی: «برا تۆ نازانی زیرە زیرِ بکەیت، وەرە لای برای خۆت فێری ئەم هونەرەت بکات.»

توومەز چۆلەکەی لەخۆبایی زمانی خۆی لەبیر چووبووەوە و نەشی دەتوانی ئاوازی بێگانە فێر ببێ.







# گرینگترین قەڵەم

جارێکیان حەوت قەڵەم لە پاکەتێکدا بوو بە مشت و مڕیان.

قەڵەمی سەوز گوتی: «من لە هەمووتان گرینگترم! چونکە دەتوانم وێنەی دارستانێک بڕەنگێنم هەموو شوێنێک بگرێتەوە.»

قەڵەمی قاوەیی گوتی: «تا ئێستا نەم بینیوە دارستان لە زناری چیادا بڕوێ. زناری چیا تاشە بەردێکی گەورەیە و هیچ شتێکی تێدا ناڕوێ. من دەتوانم وێنەی زنارێک بکێشم.»

قەڵەمی زەرد گوتی: «زنارەکەی تۆ لە ئەنجامدا دەبێتە وردە بەرد. ئیتر بۆ وێنەی کەنارێک نەکێشین؟»

قەڵەمی شین گوتی: «کەنار بەبێ دەریا وەک بیابانە. تەنیا منم کە بتوانم وێنەی دەریا و ئاسمانێکی بێ گەرد بکێشم.»

قەڵەمی سوور هاواری کرد: «منیش دەتوانم وێنەی هەتاو بکێشم. پێم ناڵێن ئێوە لەو کەنارەدا چیتان پێ دەکرێ ئەگەر دنیا تاریک و لێڵ بێت؟»

قەڵەمی ڕەش نەڕاندی: «ڕەنگی من گرینگترین ڕەنگە. کاتێ هەموو شتێک دادەپۆشم دەیکەم بە شەوی تاریک و نووتەک.»

قەڵەمی سپی هاوڕێکانی هێمن کردەوە و گوتی: «هیچ مەترسن، کاتێ من وێنەی مانگ دەکێشم، هەموو شتێک ڕووناک دەکەمەوە.»

ئیتر ئەوکاتە (بیزا)ی بچکۆلە پاکەتەکەی کردەوە، مشت و مڕەکەی وەستاند و گوتی:

«من دەتوانم وێنەی هەموو شتێک بکێشم، چونکە من هونەرمەندم، لە هەمووتان گرینگترم.»



# گورگە بۆر

بەهار بوو، بەهارێکی بەکەیف و سەفا. مێگەلە مەڕێک لە بناری کەژێکی ڕەنگین و بە گیا و گوڵ دەلەوەڕان. مێگەلەکە کۆمەڵە شوانێکی گۆپاڵ بەدەستی هەبوو. شوانەکان زۆر شادان و خەندانیان ڕادەبوارد. شەو و ڕۆژ بلوێریان دەژەند و شاییيان لەگەڵ دەکرد.

لە ناکاو دێڵە گورگێکیان لێ پەیدا بوو، جاڕس و وەڕسی کردن. هەموو شەوێ شالاوی بۆ دەهێنان و کاوڕێکی گۆشتنی لێ دەڕفاندن. چەندی خۆیان بۆی لە پارێز دەنا، گورگە بۆریان پێ نەدەگیرا. شەو تا بەیان پاسەوانییان لە مێگەل دەگرت و نەدەنووستن.

شەوێکیان، مانگ هاتبووە ناوەندی ئاسمانێ، خەرمانەی دابوو. شوانێک بلوێری لەبەر پشتێن دەرهێنا و تێی هەڵکرد. ئەوانی تریش لەناو ئەو چیمەن و گوڵزارە، لەو دەم چەم و ڕووبارە، بەشایی و سەما کەوتن.

لەپڕ کاکی بلوێرژەن، لوورەی گورگی هاتە بەر گوێ. ئاوڕی دایەوە، چ ببینێ! توومەز گورگە بۆر هاتووەتە ئەو نێزیکانە و بە هەوای بلوێرەکە بە سەما کەوتووە و تەواو ئاگای لەخۆی بڕاوە. بە









هیـوای ئەوەیە تێـر کەیف و سـەما بکا و پاشـان نێـچیـری خۆی بڕفـێنێ و هەڵێ. بـەڵام شـوانەکـان دەسـتـوبـرد شـاییـیـان بەردا و کەڕکێکیان هەڵدایە سەر پشتی گورگە بۆر و لە جێوە گرتیان.

ئەو شـەوە تا بـەیانی بە گـورگـە بۆریان ڕابـوارد. بەگۆپاڵان وەری گـەڕانێ، هێندەیان کـوتا، کـۆڵـی کـۆن و نوێیـان پێ هـەڵڕشت. بۆ بەیانیش ڕەوانەی باخـچـەی ئـاژەڵانیـان کـرد. (با لەوێ تـێـر و پڕ شایی بکا بەڵام چیتر کاوڕ نەدزێ.)





# شێر

«دایە، دێو لە کوێ دەژی؟»

«لە چیرۆکی ئەفسانەییدا.»

«کەواتە دەبێ چیرۆکی ئەفسانەییش گەورە بێت، وا نییە؟»

«بێ گومان وایە. گۆڕنەتەڵە لە چیرۆکی کورتدا دەژی و دێویش لە چیرۆکی درێژدا.»

«باشە ئەمڕۆ چیرۆکێکی چۆنم بۆ دەڵێی: کورت یان درێژ؟»

«چیرۆکێکی درێژ، گیانەکەم!»

«بژی دایە!»

(نوا) کورسییەکی هێنا. دایکی لەسەری دانیشت، کتێبێکی کردەوە و دەستی بە خوێندنەوە کرد:

«هەبوو نەبوو، ئەوکاتەی هێشتا گیانەوەران زمانی ئاخاوتنیان هەبوو. شێرێکی دڕندەی گەورە بە شای دارستان هەڵبژێردرا. هەر گیانەوەرێک بچووکترین هەڵەی بکردایە شێر ڕامالّی دەدا و دەینەڕاندە سەری، گرینگ نەبوو گیانەوەرەکە گەورە بوایە یان بچووک.

ئیتر ڕۆژێکیان شێر فەرمانی بە گەلی دارستان دا هەموو ڕۆژێ بێچووەکانی خۆیانی بۆ بێنن، بێچووە کەروێشکێک بۆ تاشتی بەیانی، بێچووە ورچێک بۆ فراوین، کار مامزێکیش بۆ شیوی ئێوارە.»

چیرۆکەکە زۆر درێژ بوو بەڵام (نوا) حەزی لێ نەدەکرد، بۆیە گوتی:

«دایە گیان، کێ ئەو شێرە بەدکارەی کردبوو بە شای گیانەوەران؟»





«گیانەوەرەکان خۆیان!» دایکی ویستی لە خوێندنەوەکەی بەردەوام بێت.

بەڵام جارێکی تریش (نوا) خوێندنەوەکەی پێ بڕی. گوتی:

«دایە گیان، بەڵام بۆچی شێریان هەڵبژاردبوو؟»

دایکی گوتی:

«چونکە لە هەموویان بەهێزتر بوو.»

نوا گوتی:

«نەیاندەتوانی یەکێکی تر هەڵبژێرن؟»

دایکی گوتی:

«دەیانتوانی، بەڵام گەلی دارستانەکە زۆر لەو بەهێزە دەترسان، بۆیە نەدەوێران لە بەرامبەری بووەستن.»

نوا گوتی:

«ئەگەر من بوایەم لەجیاتی ئەوان نەدەترسام، دەستم دەدایە تفەنگێک و دەمکوشت.»

دایکی گوتی:

«بەڵام تۆ گیانەوەر نیت، گیانەکەم، تۆ مرۆڤیت...»

نوا گوتی:

«بەڵێ دایە، من مرۆڤم لەبەر ئەوە مانگایەکم هەڵدەبژارد...»

دایکی سەری سوڕما و کتێبەکەی داخست، گوتی: «ئەمە چییە! بۆچی مانگات هەڵدەبژارد؟»

نوا گوتی:

«چونکە مانگا گۆشت ناخوات.»